# نێرەمول چییە؟

نێربوون یان مێبوونی مرۆڤ پەیوەستە بە؛

١ .کڕۆمۆسۆم[genotype] ؛ مرۆڤ ٢٣ جۆت کڕۆمۆسۆمی هەیە. لە نێراندا دووەکەی ئاخیری، [XY]ن، لە مێیانیش، دووەکەی دوایی[XX] ن .

٢ .هەبوونی ئەندامی درووستکەری تۆو و هێلکەوە؛ پیاو گونی هەیە، ژنیش هێلکەدان.

٣ .هۆڕمۆنە سێکسییەکان؛ نێر هۆڕمۆنی نێرینە [تێستۆستیرۆن-ئەندرۆجین-]ی هەیە، مێیەش هۆڕمۆنی مێینە [ئیسترۆجین] و هۆڕمۆنی زگپڕی [پڕۆجیسترۆن] هەیە .

٤ .لە ڕووی ئەندامە سێکسییەکانی دەرێ؛ کە مەبەست لێیان [چووک و زێ]ن.

٥ .نیشانە سێکسییەکان[phenotype] ؛ مەبەست لێیان هەبوونی موو و ڕدێن و سمێڵ و بەروبێڕ و مەمک و دەنگگڕی و دەنگناسکییە.

با بزانین نێوانەڕەگەز [نێرەموک] چییە

بارەکی ناباوی ڕەگەزییە. بەنێزیکەیی یەک لە دوو هەزار کەس نێوانەڕەگەزە. بەوە جیا دەکرێتەوە کە کەسەکە لە هەمان کاتدا، لەو پێنج پێکهاتەی سەرێ، قلەک یان پتری هەردوو ڕەگەزەکەی هەیە. پێشترێ وشەی یۆنانی [hermaphrodite]ی لۆ بەکار هاتییە، کە لە هەردوو وشەی [Hermes] و [Aphrodite] وەرگیرایە، کە یەکەمیان خوای نێرە، ئەوی دیکەشیان خوای مێ. ئەو وشەیە چی دیکە بەکار نەهات، چونکە جیاکاری و بەعەیبەزانین تێدا دەبینرا و مانایەکەی لۆ هەموو بارە جیاوازەکانی نێوانەڕەگەزی نابی. لەبەر هەندێ، لە ساڵی ١٩٤٠، وشەکە گۆڕدرا لۆ نێوانەڕەگەز .[intersex] لە کوردی وشەی نێرەموکی لۆ بەکار دێ. کە بەیەکەک دەگۆترێ "نێرەموک،" جیاکاری و بەعەیبەزانینی تێدایە، لەبەر هەندێ وشەی "نێوانەڕەگەز" پێشنیار دەکەین. لەبەرچی؟ چونکە ئەو بارە تەنیا ئەوانە نین کە ئەندامە سێکسییەکانی دەرێی هەردوو ڕەگەزیان هەیە، بەڵکوو کۆمەڵەک بار و چەشن و جۆری دیکەی هەیە، کە دەشێ لە هەر یەک لەو پێنج ئاستەدا بێ، کە باسمان کردن.

بەشێوەیەکی گشتی چار جۆر نێوانەڕەگەز هەن؛

١ .نێوانەڕەگەزی[46XX] ؛ کەسەکە کڕۆمۆسۆمی مێینەی هەیە، هێلکەدانی هەیە، بەڵام ئەندامی سێکسیی دەرێی لە هی نێران دەچی.

٢ .نێوانەڕەگەزی[46XY] ؛ لەوەیاندا کەسەکە کڕۆمۆسۆمی نێرینەی هەیە، بەڵام ئەندامی سێکسیی دەرێی ناتەواوە یان بە هی مێیان دەچی .

٣ .بارەکی دیش هەیە، کە هەردوو ڕژێنی سێکسی گون و هێلکدان هەن. لەوانەیە لەناو یەک بن، یانیش جودا بن. لە کڕۆمۆسۆمیش، دەکرێ ٤٦XX, 46XY، یان هەردووکیان بن. ئەندامی سێکسیی دەرێیان دەکرێ لێکنەکراوە، مێیانە، یاخود نێرانە بێ.

٤ .نێوانەرەگەزی جیانەکراوە؛ لەوەیاندا، کێشە لە کڕۆمۆسۆمەکان دەبی. لەوانەیە کڕۆمۆسۆم کەم یان زیاد بی، لەوانە، .[47XXX, 47XXY, 45XO]

لە ڕووی دەروونییەوە

بەگوێرەی توێژینەوەیەک [١]، دەرکەوتییە کە نێوانەڕەگەز نەخۆشیی جەستەیی و دەروونییان زیادتر نییە لە کەسانی ئاسایی. بەڵام بەهۆی ئەوەی کە نێوانەڕەگەزەکان بەردەوام و لە زۆربەی قۆناغەکانی تەمەنیان ڕووبەڕووی جیاکاری[discrimination] ، بەعەیبەزانین، دوورخستنەوە و شاردنەوە لە لایەن دایبابان، سووکایەتی-پێکردن، تەشقەرەی سێکسی، و چەندان جۆری دیکەی توندوتیژی دەبنەوە، ئەوا ئاساییە کە ئەوان تووشی متمانەبەخۆنەبوون، لاتەریکی، قەلەقی، شەرمنی، بەدگومانی، عەسەبیبوون، خەمۆکی، هەوڵی خۆکووشتن، تەنانەت خۆکوشتنیش دەبن.

چارەسەر

ئەتوو ڕێژیان بگرە، چارەسەریان ناوێ. ئەگەر بەخۆیان حەزیان لێ بوو و ویستیان لەسەر بوو، با وەکی خۆیان بژین و چارەسەر نەکرێن. ئەگەرنا، نەشتەرگەری، دەرمان، و چارەسەری دەروونییان گەرەکە. پێشنیار دەکەین کە سەردانی پزیشکی نەشتەرگەری و دەروونی بکەن، تا چارەسەری گونجا و پێویست وەرگرن.

نووسە ر:د. زمناکۆ خەسرەو